جۆرەکانی کێش (وەزن) لە شێعری (نالی)دا

لە و زنجیرە نووسراوەیەدا بە گوێرەی توانا هەوڵ دراوە تەواوی ئە و کێش(وەزن)انەی کە (نالی) بۆ گوتنی شێعرەکانی، کەڵکی لێوەرگرتوون یان دەکاری هێناون دەستنیشان بکرێن.

هەرچەند مەبەستی سەرەکی ئە و باسە، لێدوان لە سەر زانستی (عەرووز) و شیکردنەوەی (بەحر)ەکانی شێعری نییە، بەڵام بۆ ئاشنایی زیاتری خوێنەرەوان و لایەنگرانی شێعری نالی، بە شێوەیەکی سەرپێییش بێ، کورتە زانیارییەک سەبارەت بە (کێش) و چۆنیەتی ئاوێتەبوونی شەپۆل و درکە (دەنگ و بڕگە) کان وەڕووخراون و، پاشانیش دێڕی یەکەمی سەرجەمی ئە و غەزەل و چامە و شێعرانەی کە لە دیوانی (نالی)دا بە گوێرەی (ئەلفوبێ) هاتوون، بەڕیز نووسراونەتەوە و جۆری (کێش)ەکانیان دیاری کراون.

کێش(وەزن): کێش چەشنە ڕێکوپێکیی و گونجاوییەکی تایبەتە کە لە ئاوێنەبوونی دەنگ و درکە (شەپۆل| بڕگە) کانی شێعردا پێکدێ و، جۆرە ئاهەنگ و مۆسیاقایەک بە شێعرەکە دەبەخشێ.

پێوانە و تەرازووی کێش لە شێعری عەرووزی(یا بە زاروێژی هەڵەی باو کلاسیکی)ی کوردیدا، ئە و دەنگ و درکە یان ئە و شەپۆل و بڕگە کورت و درێژانەن کە لە دێڕێکدا بە شێوەیەکی ڕێک و گونجاو ئاوێتەدەبن و لە دێڕەکانی تردا دووپاتدەبنەوە. دیارە هەر چەشنە ڕێکی و گونجاوییەکی تایبەت، یان چۆنیەتی ئاوێتەبوون و ڕێزبوونی یەک لە دوای یەکی بڕگە کورت و درێژەکان، جۆرە کێشێکی تایبەت بە خۆیان دەخولقێنن.

جۆر و شێوەی ئاوێتەبوونی ئە و دەنگ و بڕگە کورت و درێژانە کە بە زاروێژی زانستی عەرووزی، پایە (کۆڵەکە)یان پێ دەگوترێ، بناخە و پێوەر و یەکەی کێش(وەزن) بە حیساب دێن. ئە و کۆڵەکانە، بە دوو شێوە کۆدەبنەوە: ئەگەر کێشێک لە دووپاتکردنەوەی پایەیەکی هاوچەشن واتە وەک خۆی دروست ببێ ئەوا وەزنەکە (هاوپایە)یە، وەک: موستەفعیلون موستەفعیلون موستەفعیلون؛ بەڵام ئەگەر کۆڵەکەکان هاوچەشن نەبن ئەوا وەزنەکە (ناهاوپایە)ی پێ دەگوترێ، وەک: موفتەعەلون مەفاعیلون موفتەعەلون مەفاعیلون. ئەوەش بڵێین کە هەر کۆڵەکەیەکیش بە پێی وەزنی دیاریکراو لە یەک بڕگە تا پێنج بڕگە ئاڵوگۆڕی بەسەردادێ، وەکوو: فەع(یەک بڕگە)، فەعەل(دوو بڕگە، مەفعوولو(سێ بڕگە)، موفتەعەلون(چوار بڕگە)، موستەفعەلاتون(پێنج بڕگە.(

هەڵبەت لە و جێیەڕا کە پێکهاتەی هەر پایە و کۆڵەکەیەک، کۆبەندی دەنگ و بڕگە جۆراوجۆرەکان و چۆنیەتی ئاوێتەبوونیانە، ئێمە ئەشێ بە وردی بەتایبەت لەمەڕ زمانەکەی خۆمان ئاشنایان بین.

لە زمانی کوردیدا (بە هەر دوو ستانداردی کرمانجی سەروو و خواروووەوە)، دەنگ و بڕگە (شەپۆل، درکە) کان یان بە زاروێژی زماننناسان (بزوێن (Vowel)(ەکان بە دوو دەستە دابەش دەکرێن:

1-برگە یان بزوێنە کورتەکان بریتین لە: ئە) (e)ئەرۆم، گەڕەک، وەرە)، ئو) (u)چون، سوڕ، گول)، ئۆ) (o)ئۆف، مۆر، تۆ)، ئی (î))ژین، قین، زی) ئێ) (ê)ئێش، لێڵ، ڕێ.(

2-برگە یان بزوێنە درێژەکان بریتین لە: ئا) (a) ئازیز، پاییز، کارا) ئوو) (û) ڕووت، بووک، پەڵوو)، ئیی) (îî)یاریی، فریی، دەژیی.(

ئەوەش فەرامۆش نەکرێ کە لە شێوەزاری کرمانجی سەروو، نیوچە بزوێن(سووکە بزوێن)ێک بەم نیشانەیە (ێ (i) (لە نووسیندا بووەتە باو و دەکار دەکرێ کە لە نووسینی شێوەزاری کرمانجی خوارووودا لەبەر چاوناگیرێ. دیارە بە بۆچوونی خۆم ئە و نیوچەبزوێنە دە زات و ناخی خودی دەنگە کپ(Consonant) ەکاندا هەیە و پێویست بەم نیشانەیە ناکات، وەک: ژن، دڵم، بزن، سەرقژن، زگ، جگ.

ئاشکرایە، دەستنیشانکردنی ئە و بزوێنە کورت و درێژانە بۆ ئەوەبوو کە بتوانین چۆنیەتی ئاوێتەبوون و جێگرتنیان لە شێعری (عەرووزی)دا دیاری بکەین. دیارە هەرکام لەوان ئەگەر لە شوێنی دروستی خۆیاندا ئاوێتە و جێگیر نەبن، ئەوا شێعرەکە تووشی لەنگی و لۆریی(سەکتە) دەبێ .

کێش(وەزن) لە باری چۆنیەتی پێکهاتە و ڕیزبوونی پایەکانییەوە دوو جۆرە:

1-کێشی ساغ(سالم): ئەگەر لە پایەکانی کێشێکدا، هیچ چەشنە گۆڕانێک ڕوونەدا و شکڵی ئەسڵیی کۆڵەکەکان وەک خۆیان بمێننەوە، ئەوا کێشی نێوبراو بە ساغ (سالم) لە قەڵەم دەدرێ، وەکوو: فاعیلاتون، مەفاعیلون، موستەفعیلون...

2-کێشی ناساغ(ناسالم): ئەگەر کۆڵەکەی کێشێک گۆڕانی بە سەر دابێ یان بە زاروێژی عەرووزی تووشی (زەحف، زیحاف، ئەزاحیف) هاتبێ، واتە لە ئەسڵی خۆی دوورکەوتبێتەوە ئەوا پێکهاتەی ئە و کێشە ناساغ یان (موزاحەف)ی پێ دەگوترێ، وەکوو: گۆڕانی فاعیلاتون (لە برگەی درێژەوە بۆ کورت) بە فاعیلاتو، فەعەلاتون بە فەعەلاتو...

هەروەک دەزانین چەشنی جێگرتن و ئاوێتەبوونی کۆڵەکەکان یان شێوەی (ئەفاعیل)ەکان (بەحری شێعریی) پێکدێنن. جا ئەگەر دێڕی هەر بەحرێک لە دوو پایە پێکهاتبێ ئەوا پێی دەگوترێ:

مورەببەع (چوارانە)، سێ کۆڵەکە بێ: موسەددەس (شەشانە) و، چوار کۆڵەکە بێ: موسەممەن(هەشتانە). ئەوەش بزانین کە هیچ بەحرێک (بۆ هەر دێڕێک) نابێ لە دوو پایە کەمتر و لە چوار پایە زیاتر بێ .

کاری بەسەرکردنەوەی کۆڵەکەکان و ئەوەیکە بزانین بەحرەکان لە چەند پایە پێکهاتوون و ڕیتم و مۆسیقا و ئاهەنگی ئاوێتەبوونیان چۆنە، بە زاراوێژی عەرووزی (تەقتیع)، یان (دابڕکردن)ی پێ دەگوترێ، کە لێرەدا بۆ کاری دابڕکردنی بەحر(شێعر)ەکان لە دوو نیشانەی () (بۆ بڕگەی درێژ) و(ە) (بۆ بڕگەی کورت) کەڵک وەردەگرین:

)ئەی|جیل| وە)(دە|ری| حوس|ن و)(ج| ڵەو| کێ| شی)(تە| ما| شا(

)مەف|عوو| لو) (مە| فا|عیی| لو) (مە| فا|عیی| لو) (فە| عو|لون(

ە | ە ە | ە ە |ە

هەروەک دەشزانین، لە زانستی (عەرووز) دا، بۆ هەر کێشێک نێوێکی تایبەت دیاری کراوە، بۆ نموونە ئەگەر وەزنەکە لە سەر کۆڵەکەی مەفاعییلون دامەزرابێ (هەزەج)، ئەگەر لە سەر کۆڵەکەی فاعیلاتون بێ (رەمەل) و، ئەگەریش لەسەر موستەفعیلون بێ ئەوا (رەجەز)ە. دیارە، لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەم بەحر و وەزنانەی کە (نالی) دەکاری هێناون گەلێک زۆرن و لە درێژەی باسەکەدا دەخرێنەڕوو، لێرەدا هێنانی نێوی هەموویان بە پێویست نازانم.

بەڵام، بەر لەوەی جۆری وەزنە دەکارهاتووەکانی دیوانی (نالی) لە خوارەوە دەستنیشان بکەم، پێویستە نوکتەیەکی گرینگ جەخت بکەمەوە ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵگەی کوردەواری بەتایبەت فەرهەنگی ڕۆشنبیریی لە زۆر لایەن و بوارەوە قەرزداری حەزرەتی(نالی) یە و، بۆ نموونە ئەگەر ئێمەی کورد خاوەنی ئە و بلیمەتە فەلسەفی و فەرهەنگی و زمانی و شێعرییە نەبووباین، ئەستەم بوو بتوانین باسی شێعر و ئەدەب بەتایبەت غەزەل و، هەروەها زمانی یەکگرتووی ئەدەبیی و زۆر مەسەلەی تریش بکەین. بۆ ئەوەی قسەیەکی هەروابیم نەکردبێ سەرنجی ئە و دێرەی خوارەوە بدەن و خۆتان سەرپشک بن بزانن وایە یان نا؟:

دەورانی یە وەک هێڵەگی سەودا سەری گێژم

بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم

)نالی) بێژگە لە و لایەنانەی ئاماژەی پێکرا، شارەزایی و توانایییەکی لەڕادەبەدەریشی بەسەر کێشی (عەرووزی) دا هەبووە و، توانیویەتی لە زۆربەی ئەم کێش (وەزن) ە خۆش و سوار و جێکەوتووانەی کە بۆ نموونە (سەعدی) و (حافز) لە شێعری زمانی فارسیدا دەکاریان هێناون، کەڵک وەربگرێ و دەگەڵ شێعری کوردیی بیانگونجێنێ.

لێرەدا، بۆ هاسانکاریی و جوان لێیحاڵیبوون هەوڵ دراوە، سەرەتا جۆری کێش (وەزن) و بەیتی یەکەمی شێعرەکان بنووسرێنەوە و پاشان بۆ هەر کام لەوانیش شکڵی دابڕکردنیان دیاری بکرێن:

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی خراوی کوێرکراوی قرتاو)

ئەی جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا!

سەر ڕشتەیی دین بێ مەدەدی تۆ نییە حاشا

ئەی جیلوە| دەری حوسن و| جڵەوکێشی| تەماشا!

سەر ڕشتە| یی دین بێ مە|دەدی تۆ نی| یە حاشا

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ه| ه ه | ه ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی خراوی کوێرکراوی قرتاو)

ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا

یا شەمسی جەماڵت شەوی گێراوە بە فەردا؟

ئەستێرە| هەموو مەحوە| لە نێو نووری| قەمەردا

یا شەمسی| جەماڵت شە| وی گێراوە| بە فەردا؟

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ه| ه ه | ه ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی خراوی كوێركراوی قرتاو(

تا تایی سەری توررەیی پڕ پێچشی بادا

هەرتایەكی بارێكی گوڵ و نافه بە بادا

تا تایی| سەری توررە| یی پڕ پێچ| شی بادا

هەرتایە| كی بارێكی| گوڵ و نافە| به بادا

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ه| ه ه | ه ه | ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەم و جەوهەر لە نێو ئەودا

بەڵێ مسقاڵە زەڕڕە زاهیرە جیلوەی لە پرتەودا

تەبەسسوم دەر| دەخا حوققەی| دەم و جەوهەر| لە نێو ئەودا

بەڵێ مسقا| لە زەڕڕە زا|هیرە جیلوەی| لە پرتەودا

مەفاعییلون| مەفاعییلون| مەفاعییلون| مەفاعییلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن مخبون اصلم (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی گوێبڕاو(

جۆشش و تابە لە نێو دیدەیی گریانمدا

چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تۆفانمدا

جۆشش و تا| بە لە نێو دی| دەیی گریا| نمدا

چ تەنوورێ| کە لە تەندوو| رەیی تۆفا| نمدا

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون| فەعلون

ە | ەە | ەە |

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

ڕوخم ڕەنگینی ڕەنگی ڕوومەتی ڕەنگینتە بازا!

قەدی سەروم کەمانینی قەدی شیرینتە بازا

ڕوخم ڕەنگی| نی ڕەنگی ڕوو| مەتی ڕەنگی| نتە بازا!

قەدی سەروم| کەمانینی| قەدی شیری| نتە بازا

مەفاعیلون| مەفاعیلون| مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

رجز مثمن مطوی مخبون (رەجەزی هەشتانەی پێچراوی حەشاردراو(

ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقوییەتی سەبەب دەکا

عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا

ئەحوەلی تەف| رەقە نەزەر| تەقوییەتی| سەبەب دەکا

عارفی وەح| دەت ئاشنا| لەم قسەیە| ئەدەب دەکا

موفتەعەلون| مەفاعەلون| موفتەعەلون| مەفاعەلون

ەە | ەە | ەە | ەە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

بولبولی تەبعم ئەوا دیسان سەناخوانی دەکا

نوکتەسەنجی و، بەزلەگۆیی و عەنبەرئەفسانی دەکا

بولبولی تەب|عم ئەوا دی| سان سەناخوا| نی دەکا

نوکتەسەنجی و| بەزلەگۆیی و| عەنبەرئەفشا| نی دەکا

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

گەر بێیە دەرێ، سەروی ڕەوانی لە ئیرەمدا

وەر نەییە دەرێ، ئاهوویی چینی لە حەرەمدا

گەر بێیە| دەرێ، سەروی| ڕەوانی لە| ئیرەمدا

وەر نەییە| دەرێ، ئاهوو| یی چینی لە | حەرەمدا

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعییلو| فاعیلون

ه| ه ه | ه ه | ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

تەبعی شەککەرباری من، کوردی ئەگەر ئینشا دەکا

ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی، لە (عمدا) وا دەکا

تەبعی شەککەر|باری من، کور| دی ئەگەر ئین| شا دەکا

ئیمتیحانی| خۆیە مەقسوو| دی، لە (عمدا)| وا دەکا

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

پیم دەڵێن: مەحبووبە خێل و قیچە، مەیلی شەڕ دەکا

خێل و قیچە، یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا

پیم دەڵێن: مەح| بووبە خێل و| قیچە، مەیلی| شەڕ دەکا

خێل و قیچە،| یا تەرازووی| نازی نەختێ| سەر دەکا

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی مسکین دەکا

مەستە، مەیلی چەن کەبابێکی دڵی خوێنین دەکا

چاوەکەت ئا| گر لە سینەی| عاشقی مس| کین دەکا

مەستە، مەیلی| چەن کەبابێ| کی دڵی خوێ| نین دەکا

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

٥ | ٥ | ٥ | ٥

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو)

یا بدر علوا و ضیاء و کمالا

فالغصن مع الاصل الی فرعک مالا

یا بدر|علوا و |ضیاء و | کمالا

فالغصن| مع الاصل| الی فرع| ک مالا

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

٥ | ٥٥ | ٥٥ |٥

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

حیرەتزەدە وا دیدە وەکوو حەڵقەیی دەرما

بێ مایە نییە عاشیقی بێچارە، (بفەرما!(

حیرەتزە| دە وا دیدە| وەکوو حەڵقە| یی دەرما

بێ مایە | نییە عاشی|قی بێچارە،| (بفەرما !(

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ە| ە ە | ە ە | ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا

)حەبیبە)ی (ماڵیاوا) ماڵی ئاوا!

جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا

)حەبیبە)ی (ماڵیاوا) ماڵی ئاوا!

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل

ه | ه | ه

رمل مسدس محذوف (رەمەلی شەشانەی قرتاو(

پەچەیی پەرچەمیی و، پرچی سیا

هەر دەڵیی مانگە شەوە کوڵمی تیا

پەچەیی پەرچەمیی و، پرچی سیا

هەر دەڵیی مانگە شەوە کوڵمی تیا

فاعیلاتون| فاعیلاتون | فاعیلون

ه | ه | ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

ڕیشەکەی پان و درێژە، بۆ ڕیا خزمەت دەکا

زاهیرە هەرکەس بە توول و عەرزی ڕیشیدا ڕیا

ڕیشەکەی پان و درێژە، بۆ ڕیا خزمەت دەکا

زاهیرە هەرکەس بە توول و عەرزی ڕیشیدا ڕیا

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

زولفەینی بە خەم مار و بە حەڵقەن وەکوو عەقرەب

شیعری لەف و نەشرن، چ موشەوەش، چ مورەتتەب

زولفەینی| بە خەم مار و| بە حەڵقەن وە| کوو عەقرەب

شیعری لە| ف و نەشرن، چ | موشەوەش، چ| مورەتتەب

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ە| ە ە | ە ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

ماتەم وەکوو زولفەینی سییە، گرتی سەراپات

پۆشی لە ڕوخت تەعبییەی بەیدەق و شامات

ماتەم وە| کوو زولفەینی| سییە، گرتی| سەراپات

پۆشی لە | ڕوخت تەعبی| یەی بەیدە| ق و شامات

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| مەفاعیل

ه| ه ه | ه ه | ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

چاوت لە برۆ یەعنی لە ژێر تاقی نەزارەت

بێ پەردە عەیان دێتە تەکوللوم بە ئیشارەت

چاوت لە | برۆ یەعنی | لە ژێر تاقی| نەزارەت

بێ پەردە| عەیان دێتە| تەکوللوم بە| ئیشارەت

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| فەعولون

ه| ه ه | ه ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

مەکە ئیخلافی ئە و وەعدەی کە فەرمووت

دەخیلت بم کە خانەی سەبرەکەم سووت

مەکە ئیخلا| فی ئە و وەعدەی| کە فەرمووت

دەخیلت بم| کە خانەی سەب| رەکەم سووت

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل

ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

ئەی سەروی بوڵەند قەدد و، برۆتاق و، مەمک جووت!

کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت؟!

ئەی سەروی| بوڵەند قەدد و،| برۆتاق و،| مەمک جووت!

کێ دەستی| دەگاتە بە| ی و ناری نە| گەیشتووت؟!

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| مەفاعیل

ە | ە ە | ە ە |ە

رمل مسدس مخبون محذوف (رەمەلی شەشانەی حەشاردراوی قرتاو(

عومری بێ حاسڵی من چوو بە عەبەس

ئەمەکم هەرچی هەبوو چوو بە عەبەس

عومری بێ حا| سڵی من چوو| بە عەبەس

ئەمەکم هەر| چی هەبوو چوو| بە عەبەس

فاعیلاتون| فەعەلاتون | فەعەلون

ە ە | ە ە | ە

هزج مثمن اخرب (هەزەجی هەشتانەی خراو(

عیشقت کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئیللا کچ

شیرین کج و، لەیلا کچ و، سەلما کچ و، عەزرا کچ

عیشقت کە| مەجازی بێ،| خواهیش مە|کە ئیللا کچ

شیرین کـ| چ و، لەیلا کچ و،| سەلما کـ|چ و، عەزرا کچ

مەفعوولو| مەفاعیلون| مەفعوولو | مەفاعیلون

ە | ە | ە |ە

ئە و وەزنە بەم شێوەیەش دابڕدەکرێ:

عیشقت که مه| جازی بێ،| خواهیش مەکه| ئیللا کچ

شیرین کچ و، لەیلا کچ و، سەلما کچ و، عەزرا کچ

موستەفعەلو| مەفعوولون| موستەفعەلو| مەفعوولون

ە ە| ە ە | ە ە|

هزج مثمن اخرب مکفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

ساقی! وەرە ڕەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقداح

بەم ڕاحە، لە سەر ڕاحە، دەڵێن: ڕاحەتی ئەڕواح

ساقی! وە| رە ڕەنگین کە| بە پەنجە لە| بی ئەقداح

بەم ڕاحە، | لە سەر ڕاحە،| دەڵێن: ڕاحە| تی ئەڕواح

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو| مەفاعیل

ە| ە ە | ە ە | ە ە | ە

رمل مثمن مخبون اصلم (ڕەمەلی هەشتانەی حەشاردروی گوێبڕاو(

ابروان تو طبیبان دل افگارانند

هر دو پیوسته از ان بر سر بیمارانند

ابروان| تو طبیبا| ن دل افگا| رانند

هر دو پیوس| ته از ان بر| سر بیما| رانند

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعلون

| ٥٥ | ٥٥ | ٥

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

ئیلتیقای پۆلا و ئاسن هەر نیزاعە و گیر و دار

جەمعی ماء و نار و، زەند و زەندە و، مەرخ و عەفار

ئیلتیقای پۆ| لا و ئاسن| هەر نیزاعە و| گیر و دار

جەمعی ماء و| نار و، زەند و| زەندە و، مەر| خ و عەفار

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

٥ | ٥ | ٥ | ٥

مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!

ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری (شارەزوور!(

قوربانی| تۆزی ڕێگە| تم ئەی بادی| خۆش مروور!

ئەی پەیکی| شارەزا بە | هەموو شاری| (شارەزوور!(

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعییلو| فاعیلون

ه| ه ه | ه ه| ه

رمل مثمن محذوف (ڕەمەلی هەشتانە قرتاو(

سەیلی هیجرەت بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامەدەر

باری فیکرت قەددی ڕاستی تێکشکاندم وەک فەنەر

سەیلی هیجرەت| بەردی بنچی| نەی لە ڕەگ هێ| نامەدەر

باری فیکرت| قەددی ڕاستی| تێکشکاندم| وەک فەنەر

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

مجتث مثمن مخبون اصلم (موجتەسسی هەشتانەی حەشاردراوی گوێبڕاو(

شەوی بەهاری جوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر

لە فەجری پایزی پیریی بەیانی دا تەعبیر

شەوی بەها| ری جوانی| خەوێ بوو پڕ| تەشویر

لە فەجری پا| یزی پیریی| بەیانی دا| تەعبیر

مەفاعیلون| فەعەلاتون| مەفاعیلون | فەعلون

| ە ە | ە ە | ە ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

تیر ناز نگەهک هر دلە نیجە یری وار

عاشقک پاینە زولفک گیبی یوزبک سری وار

تیر ناز | نگەهک هر| دلە نیجە| یری وار

عاشقک پا| ینە زولفک | گیبی یوزبک| سری وار

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

ئه و غەزەله بە زمانی تورکی(تورکمانی) گوتراوه، بۆ ئەوەی لە دابڕکردندا سەرنج بدرێتە بڕگەکان، ئەوا بە شێوە ڕێنووسی کوردیش دەخرێتەڕوو:

تیرێ نازێ | نیگەهەک هەر| دله نیجە| یەری وار

عاشقەک پا| ینە زولفەک | گیبی یوزبەک| سەری وار

هزج مثمن اخرب مکفوف مجبوب (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی خەساو(

ان زلف مشکبار بدان روی چون بهار

گر کوتەاست، کوتهی از وی عجب مدار

ان زلف| مشکبار ب| دان روی چون| بهار

گر کوتە| است، کوتهی| از وی عجب | مدار

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعەل

ه | ه ه| ه ه| ه

ئه و شێعرەی (نالی) خۆی چوارینەیە. شیاوی گوتنە کە ئه و کێش(وەزن)ە، تایبەتی (روباعی) یان چوارینەیە کە زۆربەی هەرە زۆری چوارینە باوەکان لە زمانی فارسیدا، لە سەر ئه و وەزنە گوتراون. دیارە ئه و کێشە بۆ گوتنی چوارینە لە زمانی کوردیشدا هەر باو بووە.

رمل مسدس محذوف (رەمەلی شەشانەی قرتاو(

خاو و بێ خاوی دوو زولفی خاوم ئەز

چاوە چاوی یەک غەزالەی چاوم ئەز

خاو و بێ خا| وی دوو زولفی| خاوم ئەز

چاوە چاوی| یەک غەزالەی| چاوم ئەز

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ

سینەپان و، مووچەکورت و، شانەبەرز و، گوێ درێژ

هەی کەرێکم| بوو، چ پەیکەر؟| تەیکەری هەو| راز و لێژ

سینەپان و، | مووچەکورت و، | شانەبەرز و،| گوێ درێژ

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

کە تۆ هاتی لە نەومیدیی نەما باس

لە هیجر و ئینتیزار ئیدیی نەما باس

کە تۆ هاتی| لە نەومیدیی| نەما باس

لە هیجر و ئین| تیزار ئیدیی| نەما باس

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل

ه | ه | ه

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

لە کن ئە و جەوهەرە فەردە لە هەیولا نییە باس

لە حیکەم پەروەریی بووعەلی سینا نییە باس

لە کن ئە و جەو| هەرە فەردە| لە هەیولا| نییە باس

لە حیکەم پەر| وەریی بوو|عەلی سینا| نییە باس

فەعەلاتون | فەعەلاتون| فەعەلاتون| فەعیلون

ه ه | ه ه | ه ه | ه ه

بسیط مثمن مخبون (بەسیتی هەشتانەی حەشاردراو(

سابوونی کەففی پێیە کەفی زاری چاپلووس

خاسیەتی ڕەققی هەیە نەرمیی زوبانی لووس

سابوونی کەف| فی پێیە| کەفی زاری | چاپلووس

خاسیەتی ڕەق| قی هەیە| نەرمیی زو| بانی لووس

موستەفعیلون| فاعیلون| موستەفعیلون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

ئەو وەزنە بەم شێوەیەش دەکاردەکرێ: موستەفعیلون فەعیلون موستەفعیلون فەعیلون

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

مووی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرە شەط

شۆرە شەط یەعنی کە تێیدا خودبەخود قەل بوو بە بەط

مووی سپی کرا دم به شوشتن| ئاوی عەینی | شۆرە شەط

شۆرە شەط یەع| نی کە تێیدا | خودبەخود قەڵ| بوو بە بەط

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

بسیط مثمن مخبون (بەسیتی هەشتانەی حەشاردراو(

قوربان مەحاڵە پێکەوە بن سەبر و ئیشتیاق

خاریج لە نەصصی ئایەیە تەکلیفی(لایطاق(

قوربان مەحا| ڵە پێکە| وە بن سەبر و| ئیشتیاق

خاریج لە نەص| صی ئایە| یە تەکلیفی| (لایطاق(

موستەفعیلون| فاعیلون| موستەفعیلون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

چییە گوارە گوناهی، وا بە نەستەق

به گوێ هەڵتاوەسیوە سەر موعەلَّەق؟!

چییە گوارە| گوناهی، وا| بە نەستەق

بە گوێ هەڵتا| وەسیوە سەر| موعەلَّەق؟!

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل

ه | ه | ه

مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئەی شۆخی بێ نیاز و گران ناز و غەمزەسووک

تیری موژەت نیشانەی دڵ کون دەکا بە نووک

ئەی شۆخی| بێ نیاز و | گران ناز و | غەمزەسووک

تیری مو| ژەت نیشانە| یی دڵ کون دە| کا بە نووک

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعییلو| فاعیلون

ه |ه ه | ه ه |ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

به هاوین جەستە خەستەی دەردی گەرمام

بە زستان دڵ شکەستەی بەردی سەرمام

به هاوین جەس| تە خەستەی دەر| دی گەرمام

بە زستان دڵ | شکەستەی بەر| دی سەرمام

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل

ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

ئەی تازەجەوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم

تا ماوە حەیاتم

دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کە بەسەرچووم

قوربانی وەفاتم

ئەی تازە| جەوان! پیرم| و ئوفتادە| و کەوتووم

تا ماوە| حەیاتم

دەستێ ب| دەرە دەستی| شکستەم، کە| بەسەرچووم

قوربانی| وەفاتم

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | مەفاعیل

ە | ە ە| ە ە| ە

مەفعوولو | مەفاعیل

ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ)

حەنایی کردووە پەنجەی بە خوێناوی دڵی زارم

ئەمە ڕەنگە شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دڵدارم

حەنایی کر| دووە پەنجەی| بە خوێناوی| دڵی زارم

ئەمە ڕەنگە | شەهادەت بێ | کە کوشتەی دەس| تی دڵدارم

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

دەورانی یە، وەک هێڵەگی سەودا سەری گێژم

بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم

دەورانی| یە، وەک هێڵە| گی سەودا سە| ری گێژم

بۆیە بە | دەقیقی مە| سەلە هەرچی| دەبێژم

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ە ە| ە ە| ە

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم

زۆرم وت و کەس تێنەگەیی، ئێستە خەمۆشم

عومرێکە | بە میزانی| ئەدەب توحفە| فرۆشم

زۆرم و| ت و کەس تێنە| گەیی، ئێستە | خەمۆشم

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ەە|ەە| ە

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم

مەشغووڵی نەفەس گرتنی مشکین نەفەسێکم

شەو هات و | ئەمن مەستی| خەیاڵاتی | کەسێکم

مەشغووڵی| نەفەس گرت| نی مشکین نە| فەسێکم

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ەە|ەە| ە

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ماچی دەمەکەی دامێ کە دامێ سەروماڵم

بنوارە چ سەیبیادە، چ جەللادە بە حاڵم!

ماچی دە| مەکەی دامێ| کە دامێ سە| روماڵم

بنوارە| چ سەیبیادە،| چ جەللادە| بە حاڵم!

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

رمل مثمن مخبون مقصور (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی کورتکراو(

لایقی مەخزەنی تەبعە هەموو کەنزی غەزەلم

قابیلی زەربی ڕەواجە زەڕ و زیوی مەسەلم

لایقی مەخ| زەنی تەبعە| هەموو کەنزی| غەزەلم

قابیلی زەر| بی ڕەواجە| زەڕ و زیوی | مەسەلم

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون| فەعەلات

ه | ه ه | ه ه | ه ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

عەزیزم ڕۆحی شیرینم، دوو چاوم

دەوای زامی دڵ و جەرگی هەناوم

عەزیزم ڕۆ| حی شیرینم،| دوو چاوم

دەوای زامی| دڵ و جەرگی| هەناوم

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعولون(

ە | ە | ە

رمل مسدس محذوف (رەمەلی شەشانەی قرتاو(

گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم

من بە برسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم

گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم

من بە برسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

وەی کە ڕووزەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم

دەرکراو و دەربەدەر، یاڕەب دەخیلی عەفوی تۆم

وەی کە ڕووزەر| دی مەدینە و | ڕووسیاهی| مەککە خۆم

دەرکراو و| دەربەدەر، یا| ڕەب دەخیلی | عەفوی تۆم

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن مخبون اصلم (ڕەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی گوێبڕاو(

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە، جەوابی نادەم

مووددەتێکە لە قەفەسدایە، عەزابی نادەم

دڵ دەڵێ سەی| ری چەمەن خۆ| شە، جەوابی| نادەم

مووددەتێکە| لە قەفەسدا| یە، عەزابی| نادەم

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون| فەعلون

ە | ەە | ەە |

رمل مثمن محذوف (ڕەمەلی هەشتانەی قرتاو(

)فاتیحە!) تەسخیرە شاری دڵ بە تابووری ئەلەم

موددەتێکی زۆرە پاتەختە لە بۆ خاقانی غەم

)فاتیحە!) تەس| خیرە شاری| دڵ بە تابوو| ری ئەلەم

موددەتێکی| زۆرە پاتەخ| تە لە بۆ خا| قانی غەم

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

لەبت میم و، قەدت ئەلف و، زوڵف چیم

دەزانی بەم سێیانە تالیبی چیم!

لەبت میم و، قەدت ئەلف و، زوڵف چیم

دەزانی بەم سێیانە تالیبی چیم!

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعولون(

ه | ه | ه

رمل مثمن مخبون اصلم (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی گوێبڕاو(

سوی مصر است مرا عزم از این لجهء غم

تا که در نیل کشم جامه ز بی داد و ستم

سوی مصر اس|ت مرا عز| م از این لج| هء غم

تا که در نی| ل کشم جا| مه ز بی داد| و ستم

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون| فەعلون

| ە ە | ە ە | ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

کە تۆی قیبلە، دەمت سا بێنە قوربان!

لە سەر قوبلە دڵم مەشکێنە قوربان!

کە تۆی قیبلە،| دەمت سا بێ| نە قوربان!

لە سەر قوبلە| دڵم مەشکێ| نە قوربان!

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعولون(

ە | ە | ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

ڕەفیقان! من ئەوا ڕۆییم لە لاتان

لە مەزڵوومان بڵا چۆڵ بێ وڵاتان

ڕەفیقان! من| ئەوا ڕۆییم| لە لاتان

لە مەزڵوومان| بڵا چۆڵ بێ| وڵاتان

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعولون(

ه | ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

لە دوگمەی سوخمە دۆینێ نوێژی شێوان

بەیانی دا سپێدەی باغی سێوان

لە دوگمەی سوخ| مە دۆینێ نوێ| ژی شێوان

بەیانی دا| سپێدەی با | غی سێوان

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعولون(

ه | ه | ه

رمل مسدس محذوف (رەمەلی شەشانەی قرتاو(

ئەهلی تەعدادی مەحاسین نووسییان

خاڵ یەک و زوڵفی دووان، هەردوو سییان

ئەهلی تەعدا| دی مەحاسین| نووسییان

خاڵ یەک و زوڵ| فی دووان، هەر| دوو سییان

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

ڕەقیب و موددەعیی فیتنە و عیلاقەی چاوی جادووتن

لە گۆشەی گۆشەوارەت نائیبی هارووت و ماروتن

ڕەقیب و مود| دەعیی فیتنە و| عیلاقەی چا| وی جادووتن

لە گۆشەی گۆ| شەوارەت نا| ئیبی هاروو| ت و ماروتن

مەفاعیلون| مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بوومن

موشکیل بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکوو من

ئەم سەرسە| ری بازانە| کەوا هەمسە| ری بوومن

موشکیل ب| گەنە ساعی| دی شاهێکی| وەکوو من

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

منسرح مثمن مطوی مکشوف (مونسەریحی هەشتانەی پێچراوی وەڕووخراو(

دووری لە من خستەوە بێ سەبەبێ یاری من

باری خودایا کە تۆ بگری سەبەبکاری من

دووری لە من| خستەوە| بێ سەبەبێ| یاری من

باری خودا| یا کە تۆ| بگری سەبەب| کاری من

موفتەعیلون| فاعیلون| موفتەعیلون| فاعیلون

ە ە | ە | ە ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

خەندە و دەمی (مەحبووبە) کەوا زۆر نمەکینن

بەس خۆشە ئەگەر خۆ نمەکی زەخم و برینن

خەندە و دە| می (مەحبووبە)| کەوا زۆر ن| مەکینن

بەس خۆشە| ئەگەر خۆ ن| مەکی زەخم و| برینن

مەفعوولو| مەفاعییلو| مەفاعییلو | فەعولون

ە | ە ە| ە ە| ە

هزج مثمن اخرب مکفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەیی شاهن

ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن

ئەم تاق|مە مومتازە| کەوا خاسسە| یی شاهن

ئاشووبی| دڵی مەملە| کەت و قەلبی| سوپاهن

مەفعوولو| مەفاعییلو| مەفاعییلو | مەفاعیل

ە | ە ە| ە ە| ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

خەتات فەرموو کە خۆشە چین و ماچین

کە ناچین، لێرە خۆشەچینی ماچین

خەتات فەرموو| کە خۆشە چی| ن و ماچین

کە ناچین، لێ| رە خۆشەچی| نی ماچین

مەفاعییلون| مەفاعییلون | مەفاعیل (فەعوولون(

ە | ە | ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

بە جان سەختیی و دڵ بەردیی، من و تۆ

بیعەینی هەر وەکوو پۆڵا و بەردین

بە جان سەختی| ی و دڵ بەردیی،| من و تۆ

بیعەینی هەر| وەکوو پۆڵا| و بەردین

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل (فەعوولون(

ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانە قرتاو(

وەک قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتوومیە ناو

تار و پۆیی عەنکەبووتە، زۆرە لێی کردوومە داو

وەک قەفەس ئەم| حوجرە کون تێ| یە کەوا گر| توومیە ناو

تار و پۆیی| عەنکەبووتە،| زۆرە لێی کر| دوومە داو

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بوو

چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو

مەفعوولو| مەفاعیيلو| مەفاعیيلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

رمل مثمن مقصور (ڕەمەلی هەشتانە کورتکراو(

تا فەلەک دەورەی نەدا، سەد کەوکەبی ئاوانەبوو

کەوکەبەی میهری موبارەک تەلعەتی پەیدا نەبوو

تا فەلەک دەو| رەی نەدا، سەد| کەوکەبی ئا| وانەبوو

کەوکەبەی میە| ری موبارەک| تەلعەتی پەی| دا نەبوو

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلات

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

دڵ شیشەیی پڕ خوێنی فیراقی، فەرەقی بوو

مەکسووری ڕقی بەودڵی وەک بەردی ڕەقی بوو

دڵ شیشە| یی پڕ خوێنی| فیراقی، فە| رەقی بوو

مەکسووری| ڕقی بەود| ڵی وەک بەردی| ڕەقی بوو

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ە ە| ە ە| ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

دەروونم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ

دڵم گەرمە و هەناسەم سەردە بێ تۆ

دەروونم پڕ| کەباب و دەر| دە بێ تۆ

دڵم گەرمە و| هەناسەم سەر| دە بێ تۆ

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل (فەعوولون(

ە | ە | ە

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ

نەچم شەرت بێ، هەتا ئەم خوارە بێ تۆ

نەمردم من| ئەگەر ئەمجا| رە بێ تۆ

نەچم شەرت بێ،| هەتا ئەم خوا| رە بێ تۆ

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیل(فەعوولون(

ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

زوڵفت کە لە سەر ڕوو بە خەم و تابیشە ئەمڕۆ

دوودی سییەهی عوودە لە سەر عاریضی پشکۆ

زوڵفت کە| لە سەر ڕوو بە| خەم و تابی| شە ئەمڕۆ

دوودی سی| یەهی عوودە| لە سەر عاری| ضی پشکۆ

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه|ه ه |ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

شەوی یەڵدایە، یا دیجوورە ئەمشەو

کە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەمشەو

شەوی یەڵدا| یە، یا دیجوو| رە ئەمشەو

کە دیدەم دوور| لە تۆ بێ نوو| رە ئەمشەو

مەفاعیيلون| مەفاعیيلون| مەفاعیل(فەعوولون(

ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ساقی! بە مەیی کۆنە لە سەر عادەتی نە و بە

بشکێنە بە یەک نەوبە دووسەد ماتەمی تەوبە

ساقی! بە| مەیی کۆنە| لە سەر عادە| تی نە و بە

بشکێنە| بە یەک نەوبە| دووسەد ماتە| می تەوبە

مەفعوولو| مەفاعیيلو| مەفاعیيلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

مضارع مثمن اخرب (موزاريعی هەشتانەی خراو(

دەستم لە گەردەنی خۆت، هەڵمەگرە ئەی(حەبیبە!(

وەبزانە خوێنی خۆمە، یا میننەتی ڕەقیبە

دەستم لە| گەردەنی خۆت|، هەڵمەگرە| ئەی(حەبیبە!(

وەبزانە خوێنی خۆمە، یا میننەتی ڕەقیبە

مەفعوولو| فاعیلاتون| مەفعوولو| فاعیلاتون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرم (هەزەجی هەشتانەی لووتکونکراو(

درونی لدار الشارزور و برده

کفرمیسک گرم الی آو سرده

)دەرونی لیداری ششارەزووری وە بەردیهی

کە فرمێسکین گە ر مین ئیلا ئاوی سەردیهی(

)دەرونی لی| داری ششا| رەزووری وە| بەردیهی

کە فرمێسکین| گە ر مین| ئیلا ئاوی| سەردیهی(

مەفاعییلون| مەفعولون | مەفاعییلون | مەفعولون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

لە دڵدا ئاتەشی عیشقت بڵێسەی میسلی تەندوورە

شەتی ئەشکم نەبێ مانیع، دەسووتێم دەبمە کۆی نوورە

لە دڵدا ئا| تەشی عیشقت| بڵێسەی میس| لی تەندوورە

شەتی ئەشکم | نەبێ مانیع،| دەسووتێم دەب| مە کۆی نوورە

مەفاعییلون| مەفاعییلون | مەفاعییلون| مەفاعییلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

وەسفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بە دەرە

ئیبتیدای مەدحی دەمی وەک خەبەری بێ ئەسەرە

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ه ه | ه ه | ه ه | ه

مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئەی ساکینی ڕیاضی مەدینەی مونەووەرە

لوتفێ بکە، بفەرموو: مەدینەی منە و، وەرە

ئەی ساکی| نی ڕیاضی| مەدینەی مو| نەووەرە

لوتفێ ب| کە، بفەرموو:| مەدینەی م| نە و، وەرە

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعیلو| فاعیلون

ه | ه ه| ه ه | ه

هزج مسدس محذوف (هەزەجی شەشانەی قرتاو(

سەراپای گوارە زەردی ترس و لەرزە

دەڵێی عاصیی بووە لە و جێگە بەرزە

سەراپای گوا| رە زەردی تر| س و لەرزە

دەڵێی عاصیی| بووە لە و جێ| گە بەرزە

مەفاعیلون| مەفاعیلون| مەفاعیل (فەعوولون(

ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

)حلقه در گوش) ی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە

با نەناڵێ، لێی مەدە (عن لطمه کف الکفه(

)حەلقە دەر گو| ش) ی کەفی ڕەن| گینی تۆیە| ئەم دەفە

با نەناڵێ،| لێی مەدە (عەن| لەتمیهی کەف| فە لکەفە(

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

کەوا زەڕتایی یەکتایی دەڵێی خورشیدی ئافاقە

مەڵێ خورشیدی ئافاقە، بڵێ میهرێ کە وا تاقە

کەوا زەڕتا| یی یەکتایی | دەڵێی خورشی| دی ئافاقە

مەڵێ خورشی| دی ئافاقە، | بڵێ میهرێ | کە وا تاقە

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

بە مەرگی خۆت قەسەم، زاهید، هەموو عومرت عوبوورێکە

مەقام و مەنزڵت، ئاخر، لە کن جەمعی قوبووریکە

بە مەرگی خۆت| قەسەم، زاهید،| هەموو عومرت| عوبوورێکە

مەقام و مەن| زڵت، ئاخر،| لە کن جەمعی| قوبووریکە

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن مخبون اصلم (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی گوێبڕاو(

سەری هەر مووی بەدەنم تەرزە تەمەنناییکە

گەردشی نووکی سەرم دووکەڵی سەوداییکە

سەری هەر مووی| بەدەنم تەر| زە تەمەننا| یێکە

گەردشی نوو| کی سەرم دوو| کەڵی سەودا| یێکە

فەعەلاتون | فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعلون

| ٥٥ | ٥٥ | ٥٥

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

شاهینی دوو چاوت کە نیگا و مەیلی بە دانگە

کێشانی بە قوللابی دڵاوێزی بژانگە

شاهینی| دوو چاوت کە| نیگا و مەیلی| بە دانگە

کێشانی| بە قوللابی| دڵاوێزی| بژانگە

مەفعوولو| مەفاعیيلو| مەفاعیيلو | فەعولون

٥ | ٥٥ |٥٥ |٥

مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

بنواڕە وشکە سۆفیی و رەقسی بە هەڵهەڵە

دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەڵە

بنواڕە| وشکە سۆفی| ی و رەقسی بە| هەڵهەڵە

دیسان لە| بەحری وشکی| هەوا کەوتە| پێ مەڵە

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعیلو| فاعیلون

ە | ەە |ەە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

شکەنجی عەرز و توولی پێچی زوڵفت بێ سەرەنجامە

مەسەل توولی ئەمەل، عومری خضر، زنجیری سەودامە

شکەنجی عەر| ز و توولی پێ| چی زوڵفت بێ| سەرەنجامە

مەسەل توولی| ئەمەل، عومری| خضر، زنجی| ری سەودامە

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب (هەزەجی هەشتانەی خراو(

سەودازەدەکەی زولْفت، ئەزهاری لە کن پەشمە

دوور لە و گوڵە بێ خارە، گوڵزاری لە کن پەشمە

سەودازە| دەکەی زولْفت،| ئەزهاری| لە کن پەشمە

دوور لە و گو| ڵە بێ خارە،| گوڵزاری| لە کن پەشمە

مەفعوولو| مەفاعیلون| مەفعوولو| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

بایێ لە تەڕەف قیبلەمەوە دێت و وەزانە

یا بۆیی هەناسەی دەمی غونچەی لەرەزانە

بایێ لە| تەڕەف قیبلە|مەوە دێت و| وەزانە

یا بۆیی| هەناسەی دە|می غونچەی لە| رەزانە

مەفعوولو| مەفاعییلو| مەفاعییلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتاکەی حیرسی وێرانە!

لەگەڵ ئەم عەشقبازانە بڕۆ بازانە، ئازانە!

ئەلا ئەی نەف| سی بووم ئاسا،| هەتاکەی حیر| سی وێرانە!

لەگەڵ ئەم عەش| قبازانە | بڕۆ بازا| نە، ئازانە!

مەفاعییلون| مەفاعییلون | مەفاعییلون| مەفاعییلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

سوروشکی من کە لێڵاوە، غوباری کۆە و هاموونە

وەرە سەرچاوەکەم بنواڕە، وەک ئاوێنە چەند ڕوونە

سوروشکی من| کە لێڵاوە،| غوباری کۆ| ە و هاموونە

وەرە سەرچا| وەکەم بنوا| ڕە، وەک ئاوێ| نە چەند ڕوونە

مەفاعییلون| مەفاعییلون | مەفاعییلون| مەفاعییلون

ه | ه | ه | ه

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

دڵ سیاسەنگ نەبێ، مائیلی خاکی وەتەنە

خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە

دڵ سیاسەن|گ نەبێ، ما|ئیلی خاکی| وەتەنە

خاڵی لەعلی| حەبەشە، سا|کینی بوردی| یەمەنە

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ه | ه ه | ه ه | ه ه

هزج مثمن اخرب (هەزەجی هەشتانەی خراو(

لە و وەختەوە بیستوومە دیتن بە قەدەر چاوە

هەر مووم لەبەدەن یەکسەر، وەک عەینی فەنەر چاوە

لە و وەختە| وە بیستوومە| دیتن بە| قەدەر چاوە

هەر مووم لە| بەدەن یەکسەر،| وەک عەینی| فەنەر چاوە

مەفعوولو| مەفاعیلون| مەفعوولو| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئە و سیلسیلە وا میشکی خەتا نێوی براوە

پڕ پێچ و شکەن، خەم بەخەم و حەڵقەکراوە

ئە و سیلسی| لە وا میشکی| خەتا نێوی| براوە

پڕ پێچ و| شکەن، خەم بە| خەم و حەڵقە| کراوە

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ە ە| ە ە| ە

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

زوڵفت بە قەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە

ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بە داوە

زوڵفت بە| قەدتدا کە| پەرێشان و| بڵاوە

ئەمڕۆ لە| منی شیف| تە ئاڵۆز و| بە داوە

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ە | ە ە| ە ە| ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

تا لە من ئە و زوڵفە ڕێی بۆسە و کەناری گرتووە

ناو دەمم بێ شوبهە تامی زەهری ماری گرتووە

تا لە من ئەو| زوڵفە ڕێی بۆ| سە و کەناری| گرتووە

ناو دەمم بێ| شوبهە تامی| زەهری ماری| گرتووە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

گوڵبنی قەددت لە قوببەی سینە غونچەی کردووە

غونچە بەم شیرینییە قەت نەیشەکەر نەیکردووە

گوڵبنی قەد| دت لە قوببەی| سینە غونچەی| کردووە

غونچە بەم شی| رینییە قەت| نەیشەکەر نەی| کردووە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

گەرمی و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە

پشکۆی گوڵاتەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە

گەرمی و تە| ڕیی بەهارە| کە پشکۆ کو| ژایەوە

پشکۆی گو| ڵاتەشین بە| نەسیم بوو گە| شایەوە

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعیلو| فاعیلون

ە | ەە | ەە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

سەری زوڵفت کە ڕشتەی عومری خضره، نیوه هەودایه

چ هەودایه؟ کە هەر حەڵقەی دوسەد زنجیری سەودایه

سەری زوڵفت| کە ڕشتەی عوم| ری خضره، نی| وه هەودایه

چ هەودایه؟| کە هەر حەڵقەی| دوسەد زنجی| ری سەودایه

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب (هەزەجی هەشتانەی خراو(

بیستم لە هەموو لایه مەیلی شەڕ و دەعوایه

سەودا لە سەرمدایه، باکم چ لە غەوغایه

بیستم لە| هەموو لایە| مەیلی شە| ڕ و دەعوایه

سەودا لە| سەرمدایه،| باکم چ| لە غەوغایه

مەفعوولو| مەفاعیلون| مەفعوولو| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف مقصور (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی کورتکراو(

سەرمایەیی سەودا کە دەڵێن زولفی دو تایە

هەر پێچشی تایێکی سەد ئاشووبی تیایە

سەرمایە| یی سەودا کە| دەڵێن زولفی| دو تایە

هەر پێچ| شی تایێکی| سەد ئاشووبی| تیایە

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | مەفاعیل

ه | ه ه| ه ه| ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

موشەخخەس لەشکری خەتت لە سەر تەسخیری باڵایە

کە توڕڕەی (میری میران) ت نیشانەی سەبتی توغرایە

موشەخخەس لەش|کری خەتت | لە سەر تەسخی| ری باڵایە

کە توڕڕەی (می| ری میران) ت| نیشانەی سەب| تی توغرایە

مەفاعیيلون| مەفاعیيلون | مەفاعیيلون| مەفاعیيلون

ه | ه | ه | ه

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

ئەڵڵا ئەڵڵا کە چ عەقڵ و چ کەماڵێکی هەیە

لەگەڵ ئە و عەقڵ و کەماڵە چ جەماڵێکی هەیە

ئەڵڵا ئەڵڵا | کە چ عەقڵ و| چ کەماڵێ| کی هەیە

لەگەڵ ئە و عەق| ڵ و کەماڵە| چ جەماڵێ| کی هەیە

فەعەلاتون | فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ه ه | ه ه | ه ه | ه ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانە قرتاو(

عاشقی بێ دڵ دەناڵی، مەیلی گریانی هەیە

بێ شکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هەیە

عاشقی بێ| دڵ دەناڵی،| مەیلی گریا| نی هەیە

بێ شکە هەو| رە تریشقە| تاوی بارا| نی هەیە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانە قرتاو(

بەرگی دنیا هێندە کورت و کۆنە و بازاڕی یە

چونکە ناگاتە گونی دێوانەکەی، لێی عاری یە

بەرگی دنیا| هێندە کورت و| کۆنە و با| زاڕی یە

چونکە ناگا| تە گونی دێ| وانەکەی، لێی| عاری یە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

با ڕەفیقانم بکەن شینم کە وەقتی زاری یە

قەت مەکەن تەقسیر لەگریان، شیوەنم یەکجاری یە

با ڕەفیقا| نم بکەن شی| نم کە وەقتی| زاری یە

قەت مەکەن تەق| سیر لەگریان،| شیوەنم یەک| جاری یە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه

رمل مثمن مخبون محذوف (ڕەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

بیدی مەجنوونە وجوودم لە هەموو بەر بەری یە

نە کەسێ مونتەفیعی یەک بەری یا سێبەری یە

بیدی مەجنوو| نە وجوودم| لە هەموو بەر| بەری یە

نە کەسێ مون| تەفیعی یەک| بەری یا سێ| بەری یە

فەعەلاتون | فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ه ه | ه ه | ه ه | ه ه

رمل مثمن محذوف (ڕەمەلی هەشتانەی قرتاو(

لە و کەسە دینی ئەتۆ نووری دڵ و ئیمانی یە

ڕوو بە زوڵفت دامەپۆشە، یەعنی کافرسانی یە

لە و کەسە دی| نی ئەتۆ نوو| ری دڵ و ئی| مانی یە

ڕوو بە زوڵفت| دامەپۆشە،| یەعنی کافر| سانی یە

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ە | ە | ە | ە

رمل مثمن مخبون محذوف (ڕەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

ئاخ لەگەڵ ئێمە (حەبیبە) سەر و پەیوەندی نییە

نەیشەکەر قەددە، بەڵا بەندی هەیە، قەندی نییە

ئاخ لەگەڵ ئێ| مە (حەبیبە) | سەر و پەیوەن| دی نییە

نەیشەکەر قەد| دە، بەڵا بەن| دی هەیە، قەن| دی نییە

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ە | ەە | ەە | ەە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

حەریقی ضیقی زیندانم، نەسیمی سوبحدەم با بێ

ئەگەر ڕۆحی منت باقیی دەوێ، ساقی! مەیی نابێ

حەریقی ضی| قی زیندانم،| نەسیمی سوب| حدەم با بێ

ئەگەر ڕۆحی| منت باقیی| دەوێ، ساقی!| مەیی نابێ

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

مەستوورە کە حەسنا و ئەدیبە بە حیسابێ

هاتە خەوم ئەمشە و بە چ نازێک و عیتابێ!

مەستوورە| کە حەسنا و| ئەدیبە بە| حیسابێ

هاتە خە| وم ئەمشە و بە| چ نازێک و| عیتابێ !

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

خوشا ڕەندێ لە دنیا، بێ موبالات و موجەڕڕەد بێ

بە ڕۆژ زیندەی جەماعەت بێ، بەشە و مات و موجەڕڕەدبێ

خوشا ڕەندێ| لە دنیا، بێ| موبالات و| موجەڕڕەد بێ

بە ڕۆژ زیندەی| جەماعەت بێ،| بەشە و مات و| موجەڕڕەدبێ

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

لە چاوی (ڕوودبار) م (نووری) دیتن وەقتە تاریی بێ

ئەمیش با ماجەرای هیجرانی (نووری ڕوودباری) بێ

لە چاوی (ڕوو| دبار) م (نوو| ری) دیتن وەق| تە تاریی بێ

ئەمیش با ما| جەرای هیجرا| نی (نووری ڕوو| دباری) بێ

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئەی قەڵعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورووجی!

وەی قوششیی دووریی کە دەڵێی قامەتی عووجی!

ئەی قەڵعە| یی ماهم کە| دەڵێی ئەوجی| بورووجی!

وەی قوشە| یی دووریی کە| دەڵێی قامە| تی عووجی !

مەفعوولو| مەفاعییلو| مەفاعییلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

هزج مثمن اخرب (هەزەجی هەشتانەی خراو(

گەر بازی نەزەربازی، لەم دەست و نیگارەت چی!

بۆ یاریی و دەسبازیی، لەم ڕاو و دیارەت چی!

گەر بازی| نەزەربازی،| لەم دەست و| نیگارەت چی!

بۆ یاری| ی و دەسبازیی،| لەم ڕاو و| دیارەت چی!

مەفعوولو| مەفاعیلون| مەفعوولو| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ئەی خەستەیی چاوت هەمو ئاهوویی تەتاری!

وەی بەستەیی زوڵفت هەمو شیرانی شکاری!

ئەی خەستە| یی چاوت هە| مو ئاهوویی| تەتاری!

وەی بەستە| یی زوڵفت هە| مو شێرانی| شکاری !

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

بێ جوێ بوونەوەیی، زەخم و برین و ئەسەرێ

تیری موژگانی درێژت لە جگەر تێ دەپەڕێ

بێ جوێ بوو| نەوەیی، زەخ| م و برین و| ئەسەرێ

تیری موژگا| نی دریژت| له جگەر تێ| دەپەڕێ

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فەعیلون

ه | ه ه | ه ه | ه ه

هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

ساقی! وەرە، مەیخانەیی دڵ کۆنە ڕەحیقی

گەر مایلی تەوفی حەرەم و بەیتی عەتیقی

ساقی! وە| رە، مەیخانە| یی دڵ کۆنە| ڕەحیقی

گەر مای|لی تەوفی حە| رەم و بەیتی| عەتیقی

مەفعوولو| مەفاعییلو| مەفاعییلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

رمل مثمن مشکول (ڕەمەلی هەشتانەی قەشانکراو(

)برق البصر) له بەر بەرق تەلەئلوئی لەئالی

)خسف القمر) له ئیشراق قیامەتی جەمالی

)بەریقەلبە| صەر) لە بەر بەر| ق تەلەئلو| ئی لەئالی

)خەسیفەلقە| مەر) لە ئیشرا| ق قیامە| تی جەمالی

فەعەلاتو | فاعیلاتون| فەعەلاتو | فاعیلاتون

ە ە ە | ە | ە ە ە | ە

مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف (موزاریعی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

بنواڕە نەوبەهار و فوتووحاتی گوڵشەنی

گوڵ زاری کردەوە، لە دەمی، غونچە پێکەنی

بنواڕە | نەوبەهار و| فوتووحاتی| گوڵشەنی

گوڵ زاری| کردەوە، لە| دەمی، غونچە| پێکەنی

مەفعوولو| فاعیلاتو| مەفاعییلو| فاعیلون

ە | ە ە | ە ە | ە

رمل مثمن مخبون محذوف (رەمەلی هەشتانەی حەشاردراوی قرتاو(

قەدری من چەندە لە لای دەوڵەتی دنیایی دەنی

قەدری ئە و کەمتر و هەردوو لە غەمی یەکدی غەنی

قەدری من چەن| دە لە لای دەو| ڵەتی دنیا| یی دەنی

قەدری ئە و کەم| تر و هەردوو| لە غەمی یەک| دی غەنی

فاعیلاتون| فەعەلاتون| فەعەلاتون | فاعیلون

ە | ەە | ەە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

موساوی وەک یەک و لوولن لە هەر دوو لاوە زولفەینی

نموونەی عەکسی حەرفی میم و نوون و واوە زولفەینی

موساوی وەک | یەک و لوولن| لە هەر دوو لا| وە زولفەینی

نموونەی عەک| سی حەرفی می| م و نوون و وا| وە زولفەینی

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ە | ە | ە | ە

هزج مثمن سالم (هەزەجی هەشتانەی ساغ(

نەفەس بگرە لە هاتوچوویی خۆڕایی هەتا ماوی

کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی

نەفەس بگرە| لە هاتوچوو| یی خۆڕایی| هەتا ماوی

کە ئەم بایە| هەتا ئێستا| کە هەر عومری| بە با داوی

مەفاعیلون| مەفاعیلون | مەفاعیلون| مەفاعیلون

ه | ه | ه | ه

رمل مثمن محذوف (ڕەمەلی هەشتانەی قرتاو(

گوڵ کە یاغی و دەم دڕاو بوو، کەوتە لاف و ڕەنگ و بۆی

باغەبان گوێی گرت و، وا هێنای بە دەستی بەستە بۆی

گوڵ کە یاغی و| دەم دڕاو بوو،| کەوتە لاف و| ڕەنگ و بۆی

باغەبان گوێی| گرت و، وا هێ| نای بە دەستی| بەستە بۆی

فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلاتون| فاعیلون

ه | ه | ه | ه

مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف (موزاريعی هەشتانەی خراوی كوێركراوی قرتاو(

تەشريفی نەوبەهارە كە عالەم دەكا نوێ

دڵ چونكە ميسلی غونچەيە بۆيێ دەپشكوی

تەشريفی| نەوبەهارە| كە عالەم دە| كا نوێ

دڵ چونكە| ميسلی غونچە| يە بۆيێ دە| پشكوێ

مەفعوولو| فاعيلاتو| مەفاعييلو| فاعيلون

ە | ەە | ەە | ە

رمل مثمن محذوف (رەمەلی هەشتانەی قرتاو(

يار دڵی خوێنين و چاوی پڕ لە گريانی دەوێ

ئارێ ئارێ گوڵ لە باغان ئاوی بارانی دەوێ

يار دڵی خوێ| نين و چاوی| پڕ لە گريا| نی دەوێ

ئارێ ئارێ| گوڵ لە باغان| ئاوی بارا| نی دەوێ

فاعيلاتون| فاعيلاتون| فاعيلاتون| فاعيلون

ه | ه | ه | ه

هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف (هەزەجی هەشتانەی خراوی کوێرکراوی قرتاو(

خاڵی نییە ڕەشماری دو زوڵفت لە بەڵایێ

حەڵقەی شەڕییان بەستووە هەر یێکە لە لایێ

خاڵی نی| یە ڕەشماری| دو زوڵفت لە| بەڵایێ

حەڵقەی شە| ڕییان بەستو| وە هەر یێکە| لە لایێ

مەفعوولو| مەفاعیلو| مەفاعیلو | فەعولون

ه | ه ه| ه ه| ه

هزج مسدس مقصور (هەزەجی شەشانەی کورتکراو(

وەرە ساقی! بە شین و نەدب و واوەی

ئەوا فەرشی حەیاتی خۆم دەکەم تەی

وەرە ساقی!| بە شین و نەد| ب و واوەی

ئەوا فەرشی| حەیاتی خۆم| دەکەم تەی

مەفاعییلون| مەفاعییلون| مەفاعیل

ە | ە | ە

هزج مسدس مقصور (هەزەجی شەشانەی کورتکراو(

)بحمدالله) دو چاوی یارم ئۆخەی

بە بێ مەی مەستە، بێ مەی مەستە بێ مەی

)بیحەمدیللا)| دو چاوی یا| رم ئۆخەی

بە بێ مەی مەس|تە، بێ مەی مەس| تە بێ مەی

مەفاعییلون| مەفاعییلون| مەفاعیل

ە | ە | ە